ناوی کتێب: نهێنی له 50/50
نووسەر: Dr. Shahad Alshammari
وەرگێڕ: فاتن احمد جليل
پێداچونەوە: موختاری کوردی
بابەت: گەشەپێدانی مرۆیی
دیزاینی بەرگ: ANQ
دیزاینی ناوەرۆک: ANQ
ژ. لاپەڕە: 90
چاپ: چاپی یەکەم
تیراژ: ١٠٠٠ دانه
ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ز

چاپی: چاپەمەنیی ئەستێرە



(To the ones still living life with love this book is for you)



{ بۆ هەموو ڕۆحێکی پاک، کە تا ئێستا باوەڕت بە خۆشەویستی هەیە ئەم کتێبەت پێشکەش بێت }

هەر وەک نوسەر دەڵێت ئەم کتێبە پێشکەشە بە هەموو ئەوانەی باوەڕیان بە خۆشەویستی هەیە...

پێشکەشە بە باوک و دایکی خۆشەویستم کە هەمیشە وەک قەڵایەک بوون لە پشتم...

(نهێنی لە 50/50 , السر في 50/50 , The secret of 50/50 ) کتێبێکی خنجیلە و جوان، کورد وتەنی دووقسەیە نەک زۆر و بۆر، بوخچەیەکە پڕ لە حیکمەتە بەرزەکان، هەمبانەیەک لێوڕێژ لە ئامۆژگاریی و ڕێنمایی. کتێبێک کە پێکهاتووە لە 50 وشەیی جیاواز و لە دووتوێی هەر وشەیەکدا، پەندێک، لە ناوەخنی هەر وتەیەکدا عەقڵێک و بیر و ڕایەک بۆ تێڕامان.

پێم خۆشە ئاماژە بەوە بکەم کە وەرگێڕانی کتێب بۆ ئەوە نییە خوێنەر فێری وشە بکا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ناوەڕۆکی ئەو بابەتەیی وەریدەگێڕی، بگەیەنێ. ئیتر گرنگ نیە تا چەند وشەکان ڕێک وەک خۆیی وەرگێڕاوە، بۆنموونە من لەم کتێبەدا هەندێ دەستەواژەم بەکارهێناوە کە لە وانەیە لە ناو زمانە بنچینەیەکەدا هەر نەبێ، یان جاری وا هەیە مەفهوم و ناوەڕۆکی بابەتەکەم نووسیوە.

بەهیوایی سود

فاتن احمد کاکەیی

# Introduction

When I was six years old, there was an old bookshop in Salmiya. The bookshop was orange, I remember, and it was called The Family Bookshop. I was learning to read and I struggled to learn. Every weekend, my parents would take me to the bookshop. One day, I chose a huge book filled with quotes from famous people, writers, politicians, and artists. It was too expensive (6 Kuwaiti Dinars) for a six year old child. My mother agreed to buy it for me, if I studied it every day.

This book stayed with me for nearly thirty years. As I grew up, I learned that life was difficult. But it wasn't ugly. It was beautiful, even in its darkness. I learned that light and dark will always learn from each other, that the sun and moon need each other, that children and adults are not too different, and that opposites will always complete each other.

This book is short because life is short. This book is a collection of wise sayings, brief descriptions, and a guide to different days in life, And, for every letter a story!

بیرم دێت کاتێک تەمەنم شەش ساڵان بوو، کتێبخانەیەکی کۆن هەبوو لە ناوچەی (سالمیة)-ڕەنگی پرتەقاڵی بوو ناوی:

**The family book shop**

. ((هێشتا فێری خوێندنەوە نەبوبوم و قورسیم لە خوێندنەوەدا بەدیدەکرد))!

هەموو کۆتای هەفتە دەچووین بۆ ئەو کتێبخانەیە، ڕۆژێکیان کتێبێکم هەڵبژارد کە پڕبوو لە وتەی ناوداران، نوسەران، سیاسەتمەداران و هونەرمەندان.

کتێبێکی گەورەو گرانبەها بوو بۆ منداڵێک لە شەش ساڵی تەمەنیدا- پێویسەیم بە شەش دینار و ڕەزامەندی دایکم بوو بۆ کڕینی کتێبەکە، بەو مەرجەی کە هەموو ڕۆژێک بە وریای کتێبەکە بخوێنمەوە، ئەم کتێبە بەردەوام بوو لەگەڵم بەدرێژای سێ ساڵ، فێربووم کە ژیان پڕە لە زەحمەتی بەڵام هەر بە جوانی دەمێنێتەوە. هەتا لە تاریکترین ساتەکان بەجوانی دەمێنێت.

فێربووم گەر تاریکی نەبێت گرینگی ڕوناکی نازانین، خۆر و مانگ یەکتر تەواو دەکەن، منداڵ جیاوازیەکی زۆری نیە لەگەڵ پێگەیشتوو وە فێربووم کە پێچەوانەکان تەواوکەری یەکترین. وەک ژیان...ئەم کتێبە زۆر دوور و درێژ نیە...

ئەم کتێبە کۆمەڵێک پەند و ئامۆژگاری کۆدەکاتەوە، وە وەسفێکی کورت، هەروەها وەک ڕێنیشاندەرێکی سادە بۆ ئەو بارودۆخانەی کە دەکرێت ڕووبەڕومان ببنەوە لە ژیانی ڕۆژانەماندا.

## Accident

There is no accident. Everything is already written for us. Every accident is part of the grand story of our life.

Even when you fall, it is no accident. You look at the world from where you are, on the floor, and it gives you a different perspective.

"Accident is the mother of invention. " (Famous American saying)



## ڕێکەووتەکان

ئەوانەی ڕوودەدەن ڕێکەوتێک نین.

هەموو شتەکان پێشتر بۆ ئێمە نووسراون. هەموو ڕووداوێک بەشێکە لە چیرۆکی گەورەی ژیانمان. تەنانەت کاتێک دەکەویت ڕێکەوت نییە. تۆ لەو شوێنەی کە لێی, لەسەرزەوی سەیری جیهان دەکەیت و دیدێکی جیاوازت پێدەبەخشێت"

ڕێکەوت دایکی داهێنانە " ( وتەیەکی بەناوبانگی ئەمریکیە).

## Age

They say age is just a number. This is not true. Age is a necessary part of life, as necessary as your physical and mental abilities. The question is not "how old are you?" but "how have you aged?" I try to watch the clock. I ask myself if I am the same person I was yesterday. If I am, then I haven't aged properly.

"The best part of the art of living is to know how to grow old gracefully. " Eric Hoffer (1902-1983).



## تەمەن

دەڵێن تەمەن تەنها ژمارەیە. هەڵەیە !

تەمەن بەشـــێکی پێویســـتە لە ژیانـــدا, بەقەد توانـــا جەســـتەیی و دەروونییەکانت پێویستە. پرسیارەکە ئەوە نییە " تەمەنت چەندە؟ " بەڵکو " چۆن تەمەنت کردووە؟ "

بەوردی سەیری میلی کـاتژمێرەکە دەکەم. لە خـۆم دەپرسـم ئایـا مـن هەمان ئەو کەسەم کە دوێنێ بـووم ئەگەر وەڵامەکەم بەڵـی بـوو ئەوا من بە باشی پێنەگەیشتووم. "یەکێـک لە باشـترین هونەرەکـانی ژیـان ئەوەیە کە بزانیت چۆن بە شکۆوە پیر دەبیت. "

ئێریک هۆفەر (1902-1983).

## Beauty

Beauty is what makes the world pause. We observe beauty silently. Beauty takes our breath away. But like I tell my students, beauty is subjective. We fight over who and what is beautiful and defend our opinions. Everyone wants to be beautiful, but the definition of beauty keeps changing.

"It has been said that a pretty face is a passport. But it's a visa, and it runs out fast. " Julie Burchill.



## جوانی

جوانی وا لەجیهان دەکات لە جـوڵە بوەسـتێت، بە بێـدەنگی چـاودێری جوانی دەکەین، جوانی شتێکی ڕێژەییە))

ئەوە ئەوشتە بوو کە باسم کرد لای خوێندکارەکانم.

هەمووان جیاوازین لەوەی کە کێ و چـی جـوانترینە، وەبەرگـری لە ڕاو و بۆچونەکانمان دەکەین. هەمووماـن بەدوای جوانیـدا دەچـین، بەڵام تێگەیشتن لە جوانی بەردەوام لە گۆڕاندایە.

((دەوترێت کە جوانی پاسپۆرتی سەفەرە ، لەکاتێکدا جـوانی مـۆڵەتی سەفەرە ،و خێرا بەسەر دەچێت)).

جولی بیرشل

## Faith

I still believe in love. Love is the answer to everything. And if you have faith, love for God, then you have love for the entire world. "Faith is the opening of all sides and every level of one's life to the divine. " Martin Luther King (1929-1969)



## ئیمان

هێشـــتا بـــاوەڕم بە خۆشەویســـتی هەیە ... خۆشەویســـتی وەڵامـــی هەموو شتێکە..

وە ئەگەر باوەڕداربیـــت، و خـــودات خۆشـــبووێت، ئەوا خۆشەویســـتی هەموو هەموو جیهان ناختی تەنیوە.

(ئیمان واتا ڕاسپاردنی هەموو کارەکانی ژیانت بە خودا )

مارتن لوثر(١٩٢٩-١٩٦٩).

## Happiness

I am still learning how to be happy. Do not worry about making others happy. It'll never satisfy you. Happiness is a cup of good coffee, or the sound of my mother s voice, the smile of a person relieved from pain, the sound of silence at the end of a long day.

"The first requisite of happiness is a clear conscience. " (Edward Gibson, 1737-1794)



## بەختەوەری

هێشتا فێردەبم چۆن دڵخۆش بم...

دڵخۆشی کەسانی تر ئاسسودەیی و ڕەزامەندیت پێ نابەخشێت، بۆیە خۆشبەختی ئەوان مەکەنە جێگایی سەرنجی خۆتان..

بەختەوەری چەندین شێوەی هەیە. ڕەنگە خۆشبەختی لە شێوەی کوپێک قاوەیی بەیانیاندا بێت، یان دەنگی دەنگی دایکم... لەوانەیە لە شێوەی زەردەخەنەی کەسێکدا بێت کە لە ئازار ڕزگاری بووە یاخود دەنگی بێدەنگی لە کۆتایی ڕۆژێکی درێژدا !

" ویژدانێکی زیندوو یەکێکە لە مەرجە بنەڕەتیەکانی خۆشبەختی".

(ئیدوارد گیبسۆن، ١٧٣٧-١٧٩٤).

## Judgement

The game we play. Society thrives on judgements.

Categories of good and bad, beautiful and ugly, rich and poor, successful or a failure. When we judge others, it taints our souls. I am still learning how to stop judging others. This is difficult as I have to un-train my brain to let go of its default setting. "Forbear to judge, for we are sinners all. " Shakespeare



## حوكمدان

حوكمدان يارييەكە كە ئێمە بەشداری تێدا دەكەین.

كۆمەڵگا لەسەر حوكمەكان گەشە دەكات، بڕیاردان لەسەر ئەوەی چی باشە یان خراپە، چی جوانە یان ناشرینە،سەركەوتووە یاخود شكست خواردووە...

حوكمدان لەسەر كەسانی تر هۆكاری پیسی ڕۆحمانە. .

هێشتا فێردەبم چۆن واز لە حوكمدان لەسەر كەسانی تر بهێنم. ئەمە قورسە چونكە دەبێت مێشكم ڕابهێنم بۆ ئەوەی واز لە ڕێكخستنە پێشوەختەكەی بهێنێت. "واز لە حوكمدان بهێنن، چونكە هەموومان گوناهبارین. " شكسپیر (1078-1717).

## Jealousy

Jealousy is a murderer. He kills Respect and Love.

"Jealousy is a terrible thing. It resembles love, only it is precisely love s contrary. " Henri Amiel (1821-1881).



## ئیرەیی

هەستکردن بە ئیرەیی کوژەرە... ئیرەیی ڕێز و خۆشەویستی دەکوژێت!

"ئیرەیی شتێکی زۆر خراپە، لە خۆشەویستی دەچێت بەڵام لە بنەڕەتدا تەواو پێچەوانەیەتی"

أمیل (١٨٢١-١٨٨١).

## Question

There is no question about your eyes. They ARE the question.

"Those who have the answer have misunderstood the question. " Anonymous



## پرسیارەکان

لە چاوەکانت ناپرسم. . .

چاوەکانت خودی پرسیارن...

"ئەوانەی وەڵامەکەیان زانیوە، بە هەڵە لە پرسیارەکە تێگەیشتوون".

نەناسراو.

## Silence

I take great pleasure in silence. Silence is the path to take when you want to discover the secrets of the universe. Meditate. Sit in silence and listen to what you can only hear when you re ready. Be ready, be open to silence.

"Quietness is indeed a sign of strength. But quietness may also help one to achieve strength. " (Franz Kafka, 1883-1924).



## بێدەنگی

بێدەنگی بۆ من چێژێکی گەورەیە..

بێــدەنگی ئەو ڕێگــایەیە کە دەیگــرینە بەر بــۆ دۆزیــنەوەی جیهــانی دەوروبەرمان...

بیربکەوە...

بە هێمنی دانیشە و گوێ بگرە بۆ ئەوەی تەنها تۆ دەتوانیت بیبیستیت...

ئامادەبە بۆ ئەوەی بە بێدەنگی دابنیشیت!

بێدەنگی نیشـانەی بەهێـزییە... بەڵام لە ڕێـگەی بێدەنگییشـەوە هێـز بەدەست دەهێنین« ! فرانز کافکا (١٨٨٣-١٩٢٤).

## Stranger

We all start out as strangers. And more often than not, we end as strangers. Do not lose yourself in-between. Do not become a stranger to yourself.

"Soon we will be strangers. No, we can never be that.

Hurting someone is an act of reluctant intimacy. We will be dangerous acquaintances with a history. " (Hanif Kureishi 1954- ).



## نامۆ

سەرەتا هەمووماں نامۆین.

هەندێک جار هەر وەکو نامۆیەک کۆتایمان دێت..

لە نێوان ئەم و ئەودا، خۆت لەدەست مەدە....

هەرگیز نامۆ مەبە بە خۆت!

((بەم زووانە نـامۆ دەبـین... نەخێـر ئەوە ڕوونـادات... ئـازاردانی کەسـێک جـۆرێکە لە ئینتـیمای سەرلێشـێواو... دەبیـنە نـامۆ بە مێژوویەکی هاوبەشەوە. ' حەنیف قورەشی (1954-).

## Trust

The gift we give to each other. People stopped valuing this immense gift of trust. I trust you. I trust you not to break my heart. I trust you not to lie to me. I trust you with my life. How can anything be as grand?

"All I have seen teaches me to trust the Creator for all I have not seen. " (Ralph Waldo Emerson, 1803-1882).



## متمانه

متمانەمان بە یەکتر هەیە...

ئەم دیارییە گەورەیە چیتر قەدری نازانرێت...

باوەڕم پێتە...

متمانەم هەیە دڵم ناشکێنیت...

متمانەم هەیە درۆم لەگەڵ ناکەیت...

ژیانمت پێ دەسپێرم ...

چ شتێک دەتوانێت هێندەیی متمانە گەورەبێت؟

هەمـوو ئەو شـتانەی کە بینیـومە فێـرم دەکەن مـتمانە بە دروسـتکەر بکەم کە هەموو ئەو شتانەی دروست کردووە کە نەمبینیوە.

ڕالف والدۆ ئیمێرسۆن (١٨٠٣-١٨٨٢).

## Us

Us and them. Us versus them. Me versus you.

Cross the bridge. Then, go back and bun the bridge.

"Let us be grateful to people who make us happy, they are the charming gardeners who make our souls blossom. " (Marcel Proust, 1871-1921).



## ئێمە

ئێمە و ئەوان..

ئێمە لە بەرامبەر ئەوان....

من بەرامبەر بە تۆ...

لە پردەکە بپەڕەوە...

پاشان بگەڕێوە و بیسووتێنە!

“پێویستە سوپاسگوزاری ئەو کەسانە بین کە دڵخۆشمان دەکەن، ئەوانەن وادەکەن ڕۆحمان گوڵ بگرێت”!

مارسێل پرۆست (١٨٧١-١٩٢١).

## Universe

The Universe and all its beauty was in my Mama's eyes.

"Gazing up at the stars, for the first time, I laid my heart open to the benign indifference of the universe. " (Albert Camus 1913-1960).



## گەردوون

جوانی  گەردوونم لە چاوی دایکمدا دۆزیەوە!

"سەیری ئەستێرەکان دەکەم. . . بۆ یەکەمجار. . . ڕێگە بە دڵم دەدەم هەست بە بێباکی گەردوون بکات!"ئەلبێرت کامۆ (١٩١٣-١٩٦٠)

## War

Humanity is always at war.

We fight each other and kill each other in the name of war. The only war you should fight is in defense of your country. There is no place like home. But I admit, I would kill for Kuwait.



## جەنگ

لە ئەزەلەوە مرۆڤایەتی لە شەڕی بەردەوامدایە...

شەڕ دەکەین و جەنگ بەرپادەکەین و بە ناوی شەڕەوە یەکتر دەکوژین...

تاکە شەڕێک کە دەبێت بیکەیت، بەرگریکردنە لە وڵاتەکەت...

هیچ شتێک لە وڵاتەکەت بەنرختر نیە...

(هەرگیز شەڕێکی باش و ئاشتییێکی خراپ بوونی نەبووە)

بنیامین فرانکلین (١٧٠٦-١٧٩٠).

## X

X out every person that has told you they loved you and then left. X them out of your memory. It will take time, and time itself takes time, but an X is all they deserve.



## نیشانەیی هەڵە (X)

ئەوەی جارێک وتی خۆشم دەوێیت و دواتر بێهیوایی کردیت شـایەنی ئەوەیە لەژیانتی دەربکەیت...

دەریانبکە  لە فەرهەنگی ژیانت...

دەزانم کە ئەمە کاتی دەوێت.. وە خودی کاتش کاتی دەوێت...

بەڵام شایەنی لەوە زیاتر نین!

## Yesterday

Dear Self,

Tomorrow you will be recycled into a newer self. You will be a yesterday. Make sure you are proud of your yesterdays.

"It s no use going back to yesterday, because I was a different person then. "

Lewis Carroll, Alice in Wonderland.



## دوێنێ

نەفسی ئازیز

سبەی نوێدەبیەوە...

دەبیت بە ڕابردوو...

با ڕابردوو شتێک بێت کە شانازی پێوە بکەیت!

هیچ سوودێکی نییە بگەڕێینەوە بۆ دوێنێ... چونکە دوێنێ کەسێکی تر بووین! (لویس کارۆل، ئەلیس لە وڵاتی سەرسوڕهێنەر).

## Zest

The word zest means enthusiasm and energy. Be passionate about your job and health and life, or else, take a back seat. You are the Captain, my friend, and a Captain does everything with zest.

"Zest is the secret of all beauty. There is no beauty that is attractive without zest. " (Christian Dior)



## چێژوەرگرتن

چێژوەرگرتن واتە گڕوتین و وزە...

هەمیشە بە پەرۆشبە بۆ کارەکانت... بۆ ژیانت... بۆ تەندروستیت...

یاخود ئامادە بە بۆ ئەوەی لە ڕیزبەندی دوو بیت نەک یەکەم....

هاوڕێی ئازیزم..

تۆ سەرکردەی...

وە سەرکردە هەموو شتێک بە جۆش و خرۆشەوە ئەنجام دەدات!

## Yours

Everything that's yours should be rightfully yours. Work hard, be kind, and build a kingdom of yours. There's no greater pleasure than knowing what you own has come to you through your effort.
"One half of me is yours, the other half is yours, Mine own, I would say; but if mine, then yours, And so all yours. " Shakespeare



## بۆ تۆ

هەمـوو شـتێک کە خاوەنـدارێتی دەکەیـت دەبێـت بە مـافی خـۆت بەدەستت هێنابێت...

بە قورسـی کـاربکە... میهرەبـان بـە.. شانشـینێکی تـایبەت بە خـۆت دروست بکە!

هیچ چێژێکی لەوە بەچێژتر نییە کە بزانیـت هەمـوو ئەو شـتانەیی کە ئێستا خاوەنیت بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆت بەدەست هێناوە!

-بەشێکی من بۆ تۆ وە بەشەکەی تریشم بۆ تۆ...

دەتوانم بڵێم هی من و موڵکی من...

بەڵام ئەگەر هـی مـن بێـت، ئەوا هـی تـۆیە کەواتە هەمـووی هەر هـی تۆیە)) شکسپیر

## Words

Never forget the words. In my last book, I said 'Forget the Words' because I wanted you to remember the words.

Remember that words have the nower to build or break.

Words have been my medicine and my life has revolved around language. Words are beautiful weapons. Choose carefully. Describe everything you feel. Say everything as though you wanted your words to be remembered.

"Words are the most powerful drug used by mankind. " Rudyard Kipling (1865-1936).

## وشەكان

هەرگیز وشەكان لەبیر مەكەن...

وشەكان هێزێكی زۆریان هەیە بۆ بنیاتنانەوە یان لەناوبردنی..

وشەكان دەرمانی منن و ژیانم لە دەوری زمانمدا دەسوڕایەوە...

وشە چەكێكی جوانە..

بە وردی وشەكانت هەڵبژێرە...

باسی هەموو ئەو هەستانەت بكە، كە هەتن. چۆنت دەوێ قسە بكە و بڵێ، وەك ئەوەی بتەوێ وشەكانت بۆ هەتاهەتایی بمێننەوە.

"وشەكان بەهێزترین چارەسەرن كە مرۆڤایەتی بەكاریان دەهێنێت" ڕودیارد كیپلینگ (١٨٦٥-١٩٣٦).

## Villain

They say every villain was once a victim. I think we make choices every day. We choose to be heroes or villains. You can be a victim and turn your life around.

Where you choose to go from there depends on you.

There are always at least two roads. Choose the one you won't regret and the one you believe in.

Both villains and heroes need to have a steadfast belief in themselves. " Jack Gleeson

# چەپەڵ

دەوترێت هەموو کەسێکی خراپەکار سەردەمانێک چەوساوە!

هەمیشە پێم وابوو کە دەبێ هەموو ڕۆژێک بڕیار بدەین... ئایا دەبێت خراپەکار یان پاڵەوان بین!

دەتوانیت ببیتە قوربانی یان ژیانت بگۆڕیت...

ئەمە بڕیاری خۆتە بۆ هەر ئاڕاستەیەک بڕۆیت!

هەمیشە لایەنی کەم دوو ڕێگا هەیە...

بۆیە.. ئەو ڕێگایە هەڵبژێرە کە دواتر هەست بە پەشیمانی نەکەیت..

ئەو ڕێگایە هەڵبژێرە کە لەگەڵ بیروباوەڕەکانتدا بگونجێت!

"خراپەکار و پاڵەوان هەردووکیان پێویستە باوەڕیان بە خۆیان هەبێت" جاک گلیسۆن

## Racism

Racism has GOT to go. We claim we are not racists - nobody wants to be called a racist.

But we judge others based on family name, on their tribe, on their roots. We refuse to marry others who are from a different race. We divide us from them. Every time we separate, we kill yet another part of us.

"Racism is the dogma that one ethnic group is condemned by nature to inferiority and another is group is destined to superiority. " Ruth Benedict (1887-1948).

## ڕەگەزپەرستی

دەبێت ڕەگەزپەرستی کۆتایی بێت!

کەس حەز ناکات پێی بڵێن ڕەگەزپەرست.

بۆیە هەمیشە وا نیشان دەدەین کە ڕەگەزپەرست نین...

لە کاتێکدا لە واقیعدا... ئێمە لەسەر بنەمایی

بـنەچەی مرۆڤەکـان... خێزانەکانیـان... ناوەکانیـان.... حوکومیـان لەسەر دەدەین.

ڕەتیدەکەینەوە پەیوەندی لەگەڵ ڕەگەزە جیاوازەکاندا ببەستین.

پۆلێنیان دەکەین... ئەوان و ئێمە...

وە هەرکاتێک جیا دەبینەوە بەشێکی خۆمان دەکوژین !

## Life

Mama gave birth to me, not once, but every day. I am my Mother's daughter. Her beliefs pump through me and the way she views the world is how I see it: colors everywhere. What is life if it weren't for a mothers love?

Life is a lifeline that connects you to your mother, and to God. Don't cut that lifeline.

"Life is ten percent what happens to me and 90 percent how I react to it. " Lou Holtz (1957- )

## ژیان

دایکم..

دایکم ژیانی پێبەخشیم..

ئەو هەموو ڕۆژێک ژیانم پێدەبەخشێت!

بیر و باوەڕەکانی لەناخمدا دێن و دەچن..

دایـک پەیوەنـدی تـۆیە بە ژیـانەوە...ڕەزامەنـدی دڵـی دایـک واتـا ڕەزامەندی پەروەردگار!

ئایا ژیان بەبێ خۆشەویستی دایک مانای هەیە؟

"10%ی ژیـان ئەوەیە کە بەسـەرتدا دێـت، 90%ی ژیـانیش ئەوەیە کە کاردانەوەت چۆن دەبێت بەرامبەر بە 10% یەکەم"

لو هۆڵتز (1957-).

## Change

Everything changes. Every single day the world hanges and we change. Nothing is set. Around us, everything is water. We keep going. All things are in motion. The difficult part is to learn how to accept change as it is. We fear change and there is a feeling that something is over because of changes. Changes are just new beginnings. My mother always said, be like the river, always moving, always changing its course.

Change is always constant.

"All things change, but nothing dies.

" (Ovid 43 B. C. -A. D. 17)

## گۆڕانکاری

هەموو شتێک لە گۆڕاندایە. هەموو ڕۆژێک جیهانی دەوروبەرمان دەگۆڕێت و ئێمەش دەگۆڕین. وەک ئاو هیچ شتێک جێگیر نیە و لە گۆڕاندایە. بەڵام بەردەوامین لە بەرەوپێش چوون. هەموو شتەکان لە گۆڕاندان، سەختییەکەی لە قبوڵکردنی گۆڕانکاریدایە. لە گۆڕانکاری دەترسین و هەست دەکەین کۆتایی نزیکە. بەڵام لە ڕاستیدا گۆڕان جگە لە سەرەتایەکی نوێ هیچی تر نییە.

دایکم هەمیشە دەیگوت : وەک ڕووبار بە هەمیشە بجوڵێ و ڕێڕەوی خۆت بگۆڕە

گۆڕانکاری هەمیشە جێگیرە

"هیچ شتێک نامرێت، بەڵام هەموو شتێک دەگۆڕێت" (ئۆڤید ٤٣ پێش زایین ١٧)

## Redemption

Everyone deserves to be saved. Everyone deserves to ask for forgiveness, to be able to find a way out of the darkness of their misdoings, their sins. if God can forgive, who are we to say you cannot be redeemed?

Remember that redemption is always there, waiting for you. Honesty is the trick. You need to really want to, spiritually, be cleansed. Redemption is a train that will save you, But there is no Return.

"No human being is so bad as to be beyond redemption. " (Mohandas Ghandi (1869-1948).

## لێبوردەیی

هەموو کەسێک شایەنی ڕزگاربوونە... مافی ئەوەی هەیە داوایی لێبـــوردن بکـــات.. بـــۆ ئەوەی بتوانێـــت ڕێـــگەی خـــۆی لە تـــاریکی و هەڵەکاندا بدۆزێتەوە...

ئەگەر خودا لە هەڵەکانمان خۆش بێت.. ئێمە کێین تا لێبوردن و لێخۆشبوون ڕەتبکەینەوە؟

لەبیرت بێت دەرگای لێبوردن هەمیشە کراوەیە و چاوەڕێی تۆیە...

نهێنی لێبوردن لە ئارەزووی دڵسۆزانە بۆ تەوبەکردندایە.

لێبوردن.. ئەوە شەمەندەفەرەیە کە ڕزگارت دەکات...

تەنیا بیرت بێت... شەقامێکی یەکلایەنەیە!

- هـــیچ کەســـێک ئەوەنـــدە خـــراپ نیـــیە کە هـــیچ هیـــوایەکی بە لێخۆشبوون نەبێت" مەهانداس گاندی (١٨٦٩-١٩٤٨).

## Music

The power of music to heal is wondrous. When I am slightly depressed, music helps me. Music connects the entire word, regardiess of language and culture. Music can keep us transfixed, disconnected from our current situation. Music pulls you to its rhythm and for a second, it all gets better.

"After silence that which comes nearest to expressing the inexpressible is music. " Aldous Huxley (1894-1963).

## مۆسیقا

مۆسیقا هێزێکی سەرسوڕهێنەر و شیفا بەخشە...

ئەو کاتانەی هەست بە دڵتەنگی دەکەم گوێ لە مۆسیقا دەگرم هەستێکی باشترم پێدەبەخشێت..

مۆسیقا زمانێکی جیهانیە..

سەرەڕای جیاوزی شارستانیەت و زمانەکان هەمیشە مۆسیقا زمانە هاوبەشەکەمانە..

مۆسیقا لەگەڵ خۆیدا دەمانبات دوور لەوەی کە سەرقاڵمان دەکات...

بۆ ئەوەی ماوەیەک بە پاکی بژین!

"مۆسیقا نزیکترین شتە دوای بێدەنگی، لە رێگەیەوە دەتوانین ئەو هەستانە دەربب‌ڕین و وەسف بکەین کە دەرنابڕدرێن." ئاڵدۆس هاکسلی (١٨٩٤-١٩٦٣)...

## Destiny

Destiny is a scary word. The word destiny makes me think that there is no way out, no exit. If it is written, then we can't change it. But destiny is also negotiable. We can negotiate with destiny. Sometimes the hand that is handed to us is not the best. Our chances at winning are less likely. Sometimes we destined to live with an illress.

Sometimes we are destined to live with pain. The second we accept this is when the burdens become lighter.

Destiny demands to be embraced.

"Our destiny commands us, even when we do not yet know what it is; it is the future which guides the rule to our present. " Priedrich Nietzsche (1844-1900).

## چارەنووس

چارەنووس وشەیەکی ترسناکە!

چارەنووس هەرچۆنێک نووسرابێت ناتوانین بیگۆڕین!

بەڵام چارەنوسیش جێی گفتوو گۆیە!

دەتوانین دانووستان لەگەڵ چارەنووسدا بکەین...

ڕەنگە ئەوانەی ڕوودەدەن دڵخۆشکەر نەبن... و هەلی سەرکەوتنمان کەم بێت...

هەندێک جار چارەنوسمان وایە لەگەڵ نەخۆشی ئازاردا بژین!

))ئەوەی بەچارەنووس ڕازی بێت خوداش لێی ڕازی دەبێ((

]چارەنووس ڕێبەرایەتیمان دەکات، تەنانەت ئەگەر نەشزانین چییە، ئەو داهاتووە کە ڕێبەری ئێستامان دەکات[

فردريك نيتشه(1844_1900).

## Victory

Celebrate every small victory. Celebrate finding that parking spot when you had almost given up. Celebrate a good night's sleep. Victories are everywhere. We just don't pay attention. Victory does not mean waging a war.

It's not about winning. Victory is a feeling of triumph, but not necessarily over others.

"You cannot expect victory and plan for defeat. " Joel Osteen

## سەرکەوتن

تەنانەت بچووکترین سەرکەوتنەکانیش ئاهەنگ بگێڕن...

چێــژ لەو ســاتە وەربگــرە کە شــوێنێکی گونجــاو دەدۆزیــتەوە بــۆ وەســتاندنی ئۆتــۆمبێلەکەت لە کاتێکــدا تەواو بێهیوابووبویــت لە هەبوونی شوێن...

ئاهەنگ بگێڕن گەر خەوێکی ئاسودەتان هەبوو...

سەرکەوتنەکان لە هەموو شوێنێکدان...

بەڵام ئێمە گرنگی پێ نادەین...

سەرکەوتن بە مانای شەڕکردن نییە...

سەرکەوتن چێژوەرگرتنە لە خۆشی سەرکەوتن...

وە پێویست ناکات دژی کەس بیت!

جۆیـل ئۆسـتین دەڵێـت: "ناتوانیـت چـاوەڕوانی سـەرکەوتن بکەیـت لەکاتێکدا پلانی شکست دادەنێیت"

## Time

Time has always confused me. One day you re here, next to me, and the next you're gone. Time ticks the way it wants, always in control of our fate. It caanot be stopped or wished away. It writes itself on our skin. I lose track,of time, try to hold it within my grasp, and always fail. Time, I m sorry. I wish I kept you.

«You can ask me for anything you like, except time. "

(Napoleon 1769-1821).

## كات

هەمیشە سەرم لە کات شێواوە..

ئەمڕۆ... تۆ لێرەیت لە تەنیشتمەوە... وە سبەی... تۆ نەماویت ...

کات تێدەپەڕێت... و کۆنترۆڵی چارەنووسمان دەکات...

نـاتوانین ڕێگـری لـێ بکەیـن... تەنـانەت گەر هیـوا بە وەستانیشـی بخوازین ناوەستێت...

کات جێپەنجەی خۆی لەسەر جەستە بەجێدەهێڵێت...

هەندێک جار ئاگـادارم لەوەی خەریـکە کـاتم لەدەسـت دەدەم.. هەوڵ دەدەم ڕێگری بکەم بەڵام ناتوانم...

ئەی کات... ببوورە.. خۆزگە دەمتوانی بتهێڵمەوە!

-دەتوانیـت داوای هەر شـتێک بکەیـت کە بتەوێـت... جـگە لە کـات!

ناپلیۆن

(١٧٦٩-١٨٢١).

## Quest

The ultimate journey is the quest. We all have a road to take and a destination to get to. What was it all for?

What was it all about? Why are you where you are today, and is this a necessary part of your quest? The quest is the traveling from one moment to another, from one place to another, and from one stage of your life to another. It is the overarching theme of your life.

"We travel, some of us forever, to seek other states, other lives, other souls. " Anais Nin(1903-177).

## بەدواداگەڕان

گەشــــتەکە لە بەدواداگەڕانـــدایە، هەریەکەمـــان ڕێگـــایەک و مەبەستێکمان هەیە کە لە هەوڵیداین بۆ گەیشتن پێی

بەڵام... بۆچی؟

ئەم گەشتەکە چی دەگەیەنێت بۆ ئێمە؟

بــۆچی لەو شــوێنەی کە لێــی؟ ئایــا ئەمە بەشــێکی پێویســتە لە هەوڵەکانتدا؟

گەڕانەکە خودی گەشتەکەیە... سات بە سات...

لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر...

سەفەر بابەتی ژیانە!

»گەشــت دەکەیــن.... هەنــدێکیان بە درێژایــی ژیانیــان وەک ڕێیــوار دەمێنــنەوە.. بەدوای بــاروودۆخی تــردا دەگەڕێــین، بــۆ ژیــانیتر.. ڕۆحیتر...«

ئانایس نین (١٩٠٣-١٩٧٧).

## Pain

Pain is a monster that lives within us. If you feed the monster, it grows. Pain is one part of life that we are born with. There is no exit. I wish I could say pain could stop the second you will it to stop. Pain is a pressure that has no clear beginning and no clear end. Pain needs to be voiced, you need to find the words to express it. Do not underestimate the power of speaking pain.

"Pain is part of the Body's magic. It is the way the body transmits a sign to the brain that something is wrong. " Norman Cousins (1912-1990).

## ئازارەکان

ئازارەکان ئەهریمەنێکن لەنێوماندا دەژین، گەر خۆراک بەم ئەهـریمەنە بدەین گەشەدەکات.

لەگەڵمان لەدایـک بـووە... حەتمیـیە! خـۆزگە توانیبـام پێـت بڵـێم کە ئازارەکان دەوستن کاتێک خۆزگە بە وەستانیان دەخوازین....

ئازار بـریتیە لە فشـارێکی بەردەوام کە سـەرەتا و کۆتـاییـیەکی ڕوونـی نییە.

ئازارکـان پێویسـتیان بەوەیە دانیـان پێـدابنێین و بە وشـەی گونجـاو دەریان ببڕین...

قسەکردن لەسەر ئازار... ڕزگار بوونە لە چنگی ئازار!

"هەستکردن بە ئازار یەکێکە لە موعجیزەکانی جەستە. ئەو شـێوازەیە کە جەستە ئاماژە بە مێشک دەدات کە شتێک هەڵەیە".

نۆرمان کوزینز (١٩١٢-١٩٩٠).

## Literatur

Literature is the oxygen of life. I teach literature every day and I realize more just how literature is our guide to life. It is the mirror to life and we learn about heroes and villains, good and bad people, the big themes of love and hatred, conflict and resolution, Literature is a world of characters, and we are currently living in one long novel. How it ends is still being written.

"Literature always anticipates life. It does not copy it, but molds it to its purpose. " Oscar Wilde (1854-1900).

## ئەدەب

ئەدەب ئۆکسجینی ژیانە ... هەر ئەوە نـا .... بەڵکـو لە ڕێگـای پراکتیـک کردن و فێرکردنی ئەدەبیاتەوە زیاتر تێدەگەم کە چۆن ئەدەب ڕێـبەری ژیانمانە...

ئەدەب ئاوێنەی ژیانە...

ڕەنگـــدانەوەی چـــاکە و خـــراپە... خۆشەویســـتی و ڕق... کێشـــە و چارەسەرە. .

ئەدەب جیهانێکی دەوڵەمەندە بە کەسایەتی جیاواز و ئێمە...

ئێمە وەک بڵێـی لەنێـوو ڕۆمـانێکی دور و درێـژدا بـژین ... کە تـا ئێسـتا کۆتایەکەیی نەهاتووە!

"ئەدەب ژیـان کـۆپی ناکـات هەمیشـە پێشـبینی ژیـان دەکـات و بە مەبەستی خۆی لە ڕووداوەکان لە قاڵب دەدات".

ئۆسکار وایڵد (١٨٥٤-١٩٠٠).

## Beginning

Reset button. Refresh. Every day is a new beginning, because every day we are alive. It doesn't matter if you are sad, hungry, poor, in pain. In the morning you are reborn the second you open your eyes. There is a new beginning waiting to happen. We start over when we are alive. Some of our beginnings in life are hard. But the trick is to keep going, not admit defeat. A beginning will change as the days go by. The first steps are usually the hardest. Once you begin, you're always half-way there.

"A bad beginning may make a good ending. "(German saying)

## دەستپێکەکان

دەستپێکەکان دوگمەی ڕێست کردنن. . . نوێبوونەوەن،
هەموو ڕۆژێک دەستپێکێکی نوێ لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، چونکە ئێمە زیندووین. گرنگ نییە دڵتەنگ بیت , برسی بیت , هەژار بیت , ئازارت هەبێ. بەڵام بەیانی جارێکی تر دێیتەوە ژیان و سەرەتایەکی نوێ چاوەڕێت دەکات.
کاتێک لە ژیانداین سەرلەنوێ دەست پێدەکەینەوە. تەنها کاتێک دەژین کە لە تواناماندا بێت سەرلەنوێ دەست پێ بکەینەوە!
ڕەنگە دەستپێکەکان قورس بن، بەڵام نهێنییەکەی لەوەدایە کە شکست قبوڵ نەکەین و بەردەوام بین لە هەوڵدان. سەرەتایەک لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژەکاندا دەگۆڕێت.
یەکەم هەنگاوەکان زۆربەی کات قورسترینن.
بەڵام هەر کە دەستت پێکرد لە نیوەی ڕێگادایت. " دەستپێکێکی خراپ لەوانەیە کۆتاییەکی باش دروست بکات "
( وتەی ئەڵمانی ).

